# سەد و پازدە ( ١١٥ )
# پرسیار و وەڵامی شەرعی
# تایبەت بە ئافرەتان

وەڵام دراونەتەوە لەلایەن :
شێخ ابن باز ، شێخ ابن عثیمین ،
شێخ فەوزان ، زانایانی لیژنەی دائیمە

وەرگێڕانی
مامۆستا هەڵگورد مصطفی گەلاڵەیی

1442 - 2021

# سەد و پازدە ( 115 ) پرسیار و وەڵامی شەرعی تایبەت بە ئافرەتان

## 1_ ئایە حوکمی دەست نوێژ و خۆشوشتنی ئەو ئافرەتە چیە کە بۆیەی لەنینۆکەکانی داوە

_ **وەڵام** : بۆ ئافرەتان دروست نیە بۆیە لەنینۆکەکانیان بدەن لەوکاتەی نوێژ دەکەن و لەکاتی بێ نوێژیدا نین ؛ چونکە بۆیەی نینۆك ڕێگری دەکات لەگەییشتنی ئاو بە نینۆکەکان ؛ بۆیە هەرشتێك ڕێگری لەگەییشتنی ئاو بکات بەنینۆك یان بەهەر ئەندامێکی تری لاشە ئەوا دروست نیە بەکاربهێنرێت .

بەڵام ئەو ئافرەتانەی بەهۆی بێ نوێژیەوە نوێژ ناکەن ئەوا بۆ ئەوان دروستە بۆیە لەنینۆکەکانیان بدەن .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە

## 2_ئایە حوكمی دەست نوێژی ئەو ئافرەتە چیە كە خەنەی لە دەستەكانی داوە ؟

_ **وەڵام** : خەنە وەكو بۆیە نیە ئەستووری لەسەر نینۆك یان پێست دروست بكات ؛ بەپێچەوانەی بۆیە و هەویر و قوڕ ؛ بەڵام ئەگەر جۆری خەنەكە وەك بۆیەی نینۆك بێت بەرگ و ئەستووری لەسەر دەست و پێ دروست بكات و ڕێگری بكات لەگەییشتنی ئاو بە پێست ئەوكات دروست نیە ئەم جۆرە خەنەیە بەكاربهێندرێت ؛ وە ئەگەر بەكارهێندرابوو ئەوا دەبێت لەكاتی دەست نوێژ و خۆشوشتن لەسەر لاشە لابدرێت .

**للایەن زانایانی لوجنەی دائیمە وەڵام دراوەتەوە .**

## 3_ئایە چۆنیەتی مەسح كردنی سەر لەكاتی دەست نوێژدا بۆ ئافرەتان بەهەمان شێوەی پیاوانە یان جیاوازە ؟

_ **وەڵام** : چۆنیەتی مەسح كردنی سەر لەكاتی دەست نوێژدا بۆ ئافرەتان بەهەمان شێوەی پیاوانە و هیچ جیاوازی نیە ؛ چونكە هیچ بەڵگەیەك نەهاتووە باس لەشێوازی مەسح كردنی سەر بكات تایبەت بە ئافرەتان ؛ بۆیە ئافرەت بەهەمان شێوەی پیاو لەكاتی مەسح كردنی سەردا دەستی تەری بەپێشەوەی سەریدا دەهێنێت هەتا دەیباتە دواوە و پاشان دەیگەڕێنێتەوە بۆ پێشەوە .

**للایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**4 _ ئایە حوکمی مەسح کردنی سەر بۆ ئافرەتان لەسەر لەچك دروستە**

_ **وەڵام** : ئەگەر لادانی لەچکەکە لەکاتی مەسح کردنی سەردا بەلایەوە زۆر قورس و ناخۆش بوو و لەچکەکەی توند لەسەر و ملی ئاڵاندبوو ئەوکات ئاساییە مەسحی لەسەر بکات چونکە ئەم جۆرە مەسح کردنە لەهەندێك لەخێزانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم – هاتووە ؛ وە ئەگەر لادانی لەچکەکە ئاسان بوو ئەوا باشتروایە دەست بباتە ژێر لەچکەکەی و مەسح لەسەر موەکانی سەری بکات و لەسەر لەچکەکەی نەکات .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**5 _ ئایە ئافرەت ئەگەر سەری بەخەنە پێچایەوە دروستە لەکاتی دەست نوێژدا مەسحی لەسەر بکات ؟**

_ **وەڵام** : ئەگەر ئافرەت سەری بەخەنە پێچایەوە دروستە مەسحی لەسەر بکات و پێوست بەوە ناکات سەری بکاتەوە و پاشان مەسحی لەسەر بکات ؛ بە بەڵگەی ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم – مەسحی لەسەر عەمامەکەی کردووە .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صاڵح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**6_ ئەکەر ئافرەت مووەکانی سەری بەڕۆن چەور کرد پاشان مەسحی لەسەر کرد یان دەست نوێژەکەی دروستە ؟**

_ **وەڵام** : ئەگەر ڕۆنەکە لەسەر مووەکانی سەر یان لەسەر هەر ئەندامێکی دەست نوێژ مایەوە و ببێتە ڕێگر لەگەییشتنی ئاو بەم ئەندامی دەست نوێژە ئەوا واجبە ڕۆنەکە لابدرێت پاشان دەست نوێژەکە بگیردرێت بەڵام ئەگەر ڕۆنەکە نەبێتە ڕێگر لەگەییشتنی ئاو بە مووەکانی سەر یان هەر ئەندامێکی دەست نوێژ ئەوا دەست نوێژ دروستە و ئاساییە .

**للایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صاڵح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**7_ ئایە دروستە پیاوان یان بۆ ئافرەتان بەبێ دەست نوێژ قورئان بخوێنێتەوە ؟**

_ **وەڵام** : خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بەبێ دەست نوێژی بۆ پیاوان و ئافرەتان دروستە و ئاساییە ؛ ئەگەرچی ئافرەت لەکاتی بێ نوێژیش دابێت دروستە و ئاساییە قورئان بخوێنێتەوە ؛ بە بەڵگەی فەرموودەی دایکە عائیشە - ڕەزای خوای لێبێت – کاتێك لەحەجدا تووشی بێ نوێژی دەبێت پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم – پێی دەفەرموێت : گشت ئەو عیبادەتانە ئەنجام بدە کە حاجی ئەنجامی دەدات تەنها تەواف کردن و نوێژ کردن نەبێت .

**پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم** – ڕێگری قورئان خوێندنەوەی لێ نەکرد و پێی نەفەرموو قورئانیش مەخوێنەوە .

وە لە فەرمودەیەکی تردا دایکە عائیشە - ڕەزای خوای لێبێت – فەرمویەتی : **پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم – لە**هەموو حالەتێکدا زیکر و یادی خوای پەروەردگاری دەکرد – کە بیگومان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز گەورەترین زیکرە - .

**للایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد ناصر الدین الالبانی – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**8_ ئایە دەست نوێژی ئافرەت دەشکێت کاتێك دەستی بەرعەورەتی منداڵەکەی دەکەوێت لەکاتی پاك کردنەوەیدا ؟**

_ **وەڵام** : ئافرەت کاتێك منداڵەکەی پاك دەکاتەوە و دەستی بەر عەورەتی منداڵەکەی دەکەوێت دەست نوێژەکەی ناشکێت ؛ چونکە دەست کەوتن بە عەورەت بەبێ شەهوەت دەست نوێژ ناشکێنێت ؛ وە بێگومان ئافرەت کاتێك منداڵەکەی پاك دەکاتەوە یان دەیشوات بەبێ شەهوەت دەستی بەر عەورەتی منداڵەکەی دەکەوێت بۆیە با دەست نوێژ گرتنەوەی لەسەر نیە تەنها با دەستەکانی پاك بکاتەوە کاتێك پیس دەبێت .

**للایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**9_ ئایە دەرچوونی با لەدامێنی ئافرەت دەست نوێژ هەڵدەوەشێنێتەوە ؟**

_ **وەڵام** : نەخێر دەست نوێژ هەڵناوەشێنێتەوە ؛ چونکە لەشوێنێکی پیس نایەتە دەرەوە و وەك ئەو بایە نیە کە لەدواوە دێتە دەرەوە .

**للایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**10_ ئایە دەست نوێژ هەڵدەوەشێتەوە بە دەست بەریەك کەوتنی ژن و مێرد ؟**

_ **وەڵام** : قەولی ڕاست و دروست دەست نوێژ بە دەست بەریەك کەوتن لەنێوان ژن و مێرد هەڵناوەشێتەوە بەهیچ شێوەیەك ئیلا ئەگەر ئاوی مەنی یان ئاوی مەذی

بێته دەرەوە ؛ بە بەڵگەی فەرموودەی دایکە عائیشە - ڕەزای خوای لێبێت – کە فەرمویەتی : پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – یەکێك لە خێزانەکانی ماچ کرد پاشان چووە بۆ نوێژ بێ ئەوەی دەست نوێژ بگرێتەوە .

ئەگەر وترا ئەی ئایەتی : ( أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ) بەڵگەنیە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی دەست نوێژ بەدەست بەرکەوتن لەنێوان ژن و مێرد ؟ لەوەڵامدا دەڵێین : مەبەست بە وشەی مولامەسە لەم ئایەتە پیرۆزەدا جیماعە - نەك بەریەك کەوتن - هەروەك لە عبدالله ی کوڕی عەبباس – ڕەزای خوای لێبێت – بە سەحیحی هاتووە .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**11_ ئایە ئافرەت لەکاتی خۆشوشتنی بێ نوێژی و لەشگرانیدا واجبە گەزیەکانی سەری بکاتەوە ؟**

_ **وەڵام** : لەکاتی خۆشوشتنی لەشگرانی یان بێ نوێژی لەسەر ئافرەت واجبە ئاو بگەیێنیتە ژێرەوەی مووەکانی سەر و دەبێت هەموو موەکانی سەری بەجوانی تر بکات .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**12_ ئایە ئافرەت لەخەودا تووشی لەشگرانی دەبێت ؟**

_ **وەڵام** : بەڵێ ئافرەتیش وەك و پیاو لەخەودا تووشی لەشگرانی دەبێت ؛ جا هەرکاتێك تووشی ئەم حالەتە بوو و تەڕایەتی بەلاشەیەوە بینی ئەوکات واجبە خۆی بشوات ؛ بەڵام ئەگەر هیچ تەڕایەتی بەخۆیەوە نەبینی ئەوا واجب نیە خۆی بشوات

؛ به بەڵگەی فەرمودەی ئوم سولەیم – ڕەزای خوای لێبێت – فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم – ئایە ئەگەر ئافرەت تووشی لەشگرانی بوو خۆشوشتنی لەسەر واجب دەبێت ؟ پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم –فەرمووی : بەڵی ئەگەر ئاوی بینی .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**13_ ئەگەر ئافرەت پێش بانگی بەیانی لەبێ نوێژی پاك بویەوە ئایە دروستە خۆشوشتنەکەی دوابخات بۆ دوای بانگی بەیانی ؟**

_ **وەڵام** : ئەگەر ئافرەت پێش بانگی بەیانی پاك بویەوە ؛ دروستە خۆشوشتنەکەی دوابخات بۆ دوای بانگی بەیانی ئینجا دوای بانگ خۆی بشوات و نوێژی بەیانی بکات ؛ بەڵام بۆی دروست نیە خۆشوشتنەکەی دوابخات بۆ دوای خۆر دەرکەوتن چونکە کاتی نوێژی بەیانی نامێنێت و نوێژەکەی لەدەست دەچێت و تووشی تاوان دەبێت .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز بن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**14_ ئایە دروستە ئەو ئافرەتانەی زۆر بەتەمەن و بەسەڵاچوون لەجیاتی دەست نوێژ تەیەمموم بکەن ؟**

_ **وەڵام** : ئەم جۆرە ئافرەتانە پێویستە بەگوێرەی توانایان دەست نوێژ بگرن ئەگەرچی بەنزیك کردنەوەی ئاوی دەست نویژیش بێت لێیان ؛ بەڵام ئەگەر

نەیانتوانی دەست نوێژ بگرن یان کەسێك نەبوو یارمەتیان بدات بۆ دەست نوێژ گرتن ئەوکات دروستە تەیەمموم بکەن .

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە وەڵام دراوەتەوە .**

**15_ئایە ماوەی بێ نوێژی ئافرەتان چەندە ؟**

_ **وەڵام** : کەمترین ماوەی بێ نوێژی ئافرەتان شەو ڕۆژێکە ؛ وە زۆرترین کاتی پازدە ڕۆژە ؛ بەڵام قەولی ڕاست و دروست هیچ سنورێکی دیاری کراو نیە بۆ کەمترین و زۆرترین کاتی بێ نوێژی ؛ چونکە بەڵگەی لەبارەوە نەهاتووە .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن ابراهیم آل شێخ – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**16_ئایە ئەگەر ئافرەتێك ماوەی بێ نوێژیەکەی 6 ڕۆژ بێت پاشان ماوەی بێ نوێژیەکەی لە 6 ڕۆژ زیاتر بوو ئایە چی بکات ؟**

_ **وەڵام** : ئەگەر ماوەی بێ نوێژی ئافرەتێك 6 ڕۆژ بێت پاشان ماوەکەی زیاتر بوو بۆ نمونە بوو بە 9 ڕۆژ یان 10 ڕۆژ یان 11 ڕۆژ ئەوا هەر بە بێ نوێژ حیسابە و نابێت نوێژ بکات هەتا پاك دەبێتەوە .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**17_ئەگەر ئافرەتێك لەماوەی بێ نوێژیدا ڕۆژێك بێ نوێژ بوو وە ڕۆژێك پاك بوو ؛ ئایە چی بکات ؟**

_ وەڵام : هەندێك لەزانایان ڕەحمەتی خوایان لێبێت فەرمویانە : ئافرەت لەماوەی بێ نوێژیدا ئەورۆژانەی خوێنی تیادا دەبێت ئەوا بێ نوێژە و نابێت نوێژەکانی بکات ؛ وە ئەورۆژانەی خوێن نابێنێت بە پاك حیسابە دەبێت خۆی بشوات و نوێژەکانی بکات ؛ هەتا ماوەی 15 ڕۆژ ؛ پاشان ئەوەی لەدوای 15 رۆژ دێت بەخوێنی دەمار و نەخۆشی حیسابە و دەبێت نوێژەکانی بکات .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین - ڕەحمەتی خوای لێبێت - وەڵام دراوەتەوە .

18_ ئایە ئافرەت لەکاتی دووگیانیدا تووشی بێ نوێژی دەبێت ؟

_ وەڵام : هەندێك لە ئافرەتان هەن لەدوای ئەوەی کە دووگیان دەبن لەکاتی عادەی خۆیان هەموو مانگێك تووشی بێ نوێژی دەبن ؛ ئەم جۆرە ئافرەتانە نابێت نوێژەکانیان بکەن ؛ وە نابێت ڕۆژوەکانیان بگرن هەتا پاك دەبنەوە چونکە دووگیانیەکەیان کاریگەری لە ڕاگرتنی خوێنی بێ نوێژیان نەکردووە ؛ وە هەندێك لە ئافرەتان لەکاتی دووگیانیاندا بەهۆی ڕوداوێك یان بەهۆی هەڵگرتنی شتێکی قورس یان بەهۆی کەوتنیان تووشی خوێن هاتن دەبن ئەم جۆرە ئافرەتانە دەبێت لەسەر نوێژەکانیان بەردەوام بن چونکە ئەم خوێنە خوێنی نەخۆشیە و نابێتە ڕێگر لە نوێژکردن و بەڕۆژوو بوون .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین - ڕەحمەتی خوای لێبێت - وەڵام دراوەتەوە .

19_ ئایە بۆ ئافرەت دروستە لەکاتی بێ نوێژیدا دەست لەم پەرتوکانە بدات کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی تێدایە ؟

_ وەڵام : حەڕام نیە بۆ ئافرەت لەکاتی بێ نوێژیدا دەست لەوگۆڤار و پەرتوکانە بدات کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیان تێدایە چونکە ئەم گۆڤار و پەرتوکانە موسحەفی قورئان نین هەتا بۆی دروست نەبێت دەستیان لێ بدات .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**20_ ئایە دروستە ئافرەت لەکاتی بێ نوێژیدا بچێتە ناو مزگەوت یان بەناویدا بڕوات ؟**

_ وەڵام : بۆ ئافرەت دروست نیە لەکاتی بێ نوێژیدا بچێتە ناو مزگەوت و تیایدا بمێنێتەوە ؛ بەڵام ڕۆییشتن بەناو مزگەوت لەکاتی پێویستدا بۆی دروستە و ئاساییە ؛ والله أعلم .

لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە – ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**21_ ئایە حوکمی حەبی مەنعی سوری مانگانە بۆ ئافرەتان چیە ؟**

_ وەڵام : حەبی مەنعی سووری مانگانە دروستە بەمەرجێك زیانی تەندروستی نەبێت وە بە ئیزنی مێردی بێت ؛ وە ئەوەی من زانیومە ئەم جۆرە حەبانە زیانی تەندروستیان هەیە ؛ چونکە دەرچوونی خوێنی بێ نوێژی دەرچوونێکی سروشتیە ؛ وە شتی سروشتی ئەگەر لەکاتی خۆی ڕێگری لێکرا ئەوە بێگومان زیانی دەبێت بۆ تەندروستی لاشە ؛ وە هەروەها دەبێتە هۆی تێك چوونی عادەی بێ نوێژیان بۆیە باشتروایە خۆیان لەم جۆرە حەبانە بپارێزن .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**22_ ئایە ئافرەت لەکاتی زەییستاندا هەتا کەی نابێت نوێژ بکات ؟**

_ **وەڵام** : زەییستان چەند حالەتێکی هەیە :

**یەکەمیان** : ئەگەر پێش تەواو بوونی چل رۆژ پاك بویەوە ئەوا دەبێت خۆی بشوات و نوێژ و باقی عیبادەتەکانی بکات .

**دووەمیان** : پێش چل ڕۆژ پاك دەبێتەوە پاشان دووبارە پێش ئەوەی ببێت بە چل ڕۆژ بێ نوێژ دەبێتەوە ؛ ئەوا ئەوکاتەی کەپاك دەبێتەوە دەبێت خۆی بشوات و نوێژەکانی بکات وەکاتێك بێ نوێژ دەبێتەوە دەبێت واز لەنوێژکردن بێنێتەوە هەتا پاك دەبێتەوە .

**سێیەمیان** : هەتا چل رۆژ بەردەوام بێ نوێژە ؛ لەوماوەیەدا نابێت نوێژ بکات هەتا چل رۆژ تەواو دەبێت و پاك دەبێتەوە .

**چوارەمیان** : لەدوای چل ڕۆژ تووشی عادەی سووری مانگانە دەبێ لەوکاتهدا دەبێت واز لەنوێژ کردن بێنێت هەتا پاك دەبێتەوە .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن ابراهیم آل الشیخ – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**23_ ئایە ئافرەت ئەگەر پێش چل رۆژ  لە زەییستاندا پاك بویەوە دروستە نوێژ و رۆژوەکانی جێ بەجێ بکات ؟**

_ وەڵام : هەرکاتێك ئافرەت لەزەییستان پاك بویەوە ئەگەرچی پێش چل رۆژیش بێت ئەوا دەبێت خۆی بشوات و دروستە نوێژ و رۆژوو و جووت بوون لەگەڵ هاوسەرەکەیی و باقی کارە شەرعیەکانی بکات .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثيمين – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**24_ ئەگەر ئافرەتی دووگیان منداڵی بوو پاشان خوێنی نەبینی و تووشی زەییستان نەبوو ؛ ئایە دروستە نوێژەکانی بکات ؟**

**_ وەڵام : ئەگەر ئافرەتی دووگیان لەدوای منداڵ بوونی خوێنی نەبینی و تووشی زەییستان نەبوو ؛ واجبە لەسەر خۆی بشوات و نوێژەکانی بکات ؛ وە ڕۆژو و باقی کارە شەرعیەکانی بۆ دروستە .**

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە – ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**25_ ئایە ئەو ئافرەتانەی کۆرپەلەیان لەباردەچێت ؛ نوێژکردنیان لەسەرە ؟**

**_ وەڵام : ئەگەر ئافرەتێك کۆرپەلە لەبارچووەکەی تەواو دروست کرابوو و دەست و قاچ و سەری پێوەبوو ؛ ئەوا ئەو خوێنەی بەدوایدا دێت بەزەییستان حیسابە و نابێت نوێژەکانی بکات هەتا پاك دەبێتەوە ؛ بەڵام ئەگەر کۆرپەلەکەی دروست نەببوو و تەنها پارچە خوێنێك بوو یان پارچە گۆشتێك بوو ئەوا ئەو خوێنەی بەدوایدا دێت بە خوێنی نەخۆشی حیسابە و دەبێت نوێژەکانی بکات ؛ وە بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژ بگرێتەوە .**

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزيز بن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

26_ ئایە ئەگەر ئافرەت تووشی خوێن بەربوون بوو و بەردەوام خوێن ببینێت چۆن نوێژەکانی بکات ؟

_ وەڵام : حوکمی ئەم جۆرە ئافرەتانە ئەوەیە ئەگەر ئەم ئافرەتە پێش خوێن بەربونەکە عادەتی لەسەرەتای مانگ بۆماوەی شەش ڕۆژ بێ نوێژ دەبوو ئەوە دەبێت بەهەمان شێوە لەسەرەتای هەموو مانگێك شەش ڕۆژ نوێژەکانی نەکات پاشان خۆی بشوات و نوێژەکانی بکات ئەگەرچی خوێن بەربوونەکەشی هەر بەردەوام بێت .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

27_ ئایە ئەو ئافرەتانەی بەنەشتەرگەری لەڕێگەی زگیان کۆرپەلەکەیان دەردەهێنرێت بە زەییستان ئەژماردەکرێن ؟

_ وەڵام : حوکمی ئەم جۆرە ئافرەتانە هەمان حوکمی ئەو ئافرەتانەیە کە بەسروشتی منداڵیان دەبێت ؛ بۆیە بەزەییستان ئەژماردەکرێن ئەگەر خوێن ببینن ؛ بۆیە لەدوای دەرهێنانی منداڵەکە نابێت نوێژ و باقی کارە شەرعیەکان بکەن هەتا ئەوکاتەی پاك دەبنەوە و خۆیان دەشۆن .

لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

28_ ئایە بۆ ئافرەتان دروستە بانگ بدەن و قامەت بکەن ؟

_ وەڵام : نەخێر بۆ ئافرەتان دروست نیە نە بانگ بدەن وە نە قامەت بکەن ؛ بانگ و قامەت تایبەتە بەپیاوان بە بەڵگەی فەرمووده سەحیحەکانی پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم - .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز بن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**29_ ئایە دروستە ئافرەت پێش نوێژی بکات ؟**

_ **وەڵام** : بەڵێ دروستە ئافرەت پێش نوێژی بۆ ئافرەتان بکات – بەڵام نابێت پێش نوێژی بۆ پیاوان بکات - ؛ دایکە عائیشە و ئوم سەلەمە - ڕەزای خوای پەروەردگاریان لێبێت – پێش نوێژیان بۆ ئافرەتان کردووە ؛ بۆیە ئەگەر ئافرەتێکی قورئان خوێن و شارەزا پێش نوێژی بۆ ئافرەتان کرد ئەوها کارێکی باشی کردووە و دروستە ؛ وە ئافرەت لەکاتی پێش نوێژی کردنیدا دەبێت لەناوەراستی ڕیزی پێشەوە بوەستێت و نابێت بچێتە پێشەوە .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز بن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**30_ ئایە ئافرەت ئەگەر لەناو نوێژدا بەشێك لەپرچی بەدەرەوە بوو نوێژەکەی هەڵدەوەشێتەوە ؟**

_ **وەڵام** : ئەگەر کەمێك لەپرچی یان لاشەی لەناو نوێژدا بەدەرکەوت ئەوا دوبارە کردنەوەی نوێژەکەی لەسەر نیە لە لای زۆربەی زانایان ؛ بەڵام ئەگەر زۆرێك لەپرچی یان لاشەی دەرکەوت ئەوا لە لای گشت زانایان نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و دەبێت دووبارەی بکاتەوە ؛ والله أعلم .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخی ئیسلام ابن تەیمیە – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**31_ ئایە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی هەیە کە دروست نەبێت بۆ ئافرەت لەکاتی نوێژکردنی بێجامەی ژێر پۆشاکە شەرعیەکەی لەبەربێت ؟**

**_ وەڵام : نەخێر هیچ بەڵگەیەکی شەرعی نیە کە داوا لە ئافرەت بکات لەکاتی نوێژکردنی پۆشاکی ژێرەوەی دابنێت بەتایبەت ئەگەر ئەم پۆشاکەی ژێرەوەی پاك بێت و پیس نەبێت .**

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**32_ ئەگەر ئافرەت ناچاربوو بە ئامادەبوونی پیاوانی نامەحرەم نوێژ بکات ؛ ئایە نوێژەکەی چۆن بکات ؟**

**_ وەڵام : لەسەر ئافرەت واجبە لەکاتی نوێژکردن هەموو لاشەی داپۆشێت تەنها دەست و ڕوخساری نەبێت ؛ بەڵام لەکاتی ئامادەبوونی پیاوانی نامەحرەم دەبێت دەست و ڕوخساریشی داپۆشێت .**

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**33_ ئایە دروستە ئافرەت لەکاتی نوێژکردن پێیەکانی داپۆشراو نەبێت ؟**

**_ وەڵام : لە لای جومهوری زانایان واجبە ئافرەت لەکاتی نوێژکردن پێیەکانی داپۆشێت ؛ بۆیە پێویستە ئافرەتان لەکاتی نوێژ کردندا پێیەکانیان بە پۆشاکیان یان بەگۆرەوی داپۆشن .**

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

34_ ئەگەر ئافرەت لەکاتی عەسر لەبێ نوێژی پاك بویەوە ئایە نوێژ نیوەڕۆشی لەسەر واجب دەبێت ئەنجامی بدات ؟

_ وەڵام : قەولی راست و دروست ئەوەیە کە تەنها نوێژی عەسری لەسەر واجب دەبێت ئەنجامی بدات ؛ چونکە هیچ بەڵگەیەك نیە نوێژی نیوەڕۆشی لەسەر واجب بێت - وە کاتەکە کاتی نوێژی عەسرە و کاتی نوێژی نیوەرۆ بەسەر چووە و نەماوە - .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین - ڕەحمەتی خوای لێبێت - وەڵام دراوەتەوە .

35_ ئەگەر ئافرەت لەدوای چوونە ناو کاتی نوێژ تووشی بێ نوێژی بوو وە ئەو نوێژەی هێشتا نەکردبوو ئایە لەدوای پاك بوونەوەی ئەم نوێژەی لەسەر واجبە بگێرێتەوە ؟

_ ئەگەر ئافرەت لەدوای چوونە ناو کاتی نوێژ تووشی بێ نوێژی بوو واجبە لەسەری لەدوای پاك بوونەوە ئەم نوێژەی بگێرێتەوە.

وە ئەگەر ئافرەت بەچەند خولەکێکی کەم پێش تەواو بوونی کاتی نوێژ پاك بویەوە و پاشان کاتی نوێژی تر داهات ئەوا دەبێت ئەو نوێژەی بگێڕێتەوە کە تیایدا پاك بویەوە .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین - ڕەحمەتی خوای لێبێت - وەڵام دراوەتەوە .

**36 _ ئایە لەسەر ئافرەتان واجبە نوێژەکانیان لەمزگەوت بەجەماعەت بکەن ؟**

_ **وەڵام** : نەخێر لەسەر ئافرەتان واجب نیە نوێژەکانیان لەمزگەوت بە جەماعەت بکەن ؛ تەنها لەسەر پیاوان واجبە نوێژەکانیان لەمزگەوت بە جەماعەت بکەن ؛ بۆ ئافرەتان خێر تر و باشترە لەماڵەوە نوێژە فەرزەکانیان ئەنجام بدەن .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**37_ ئایە ئەگەر ئافرەت لەکاتی بێ نوێژی یان لەکاتی زەییستان مرد دروستە لەمزگەوت نوێژی مردووی لەسەر بکرێت ؟**

_ **وەڵام** : بەڵێ دروستە - بەمەرجێك مردووەکە جوان شورابێت و پاك راگیرابێت - ؛ چونکە حوکمەکانی بێ نوێژی و زەییستان بەمردن کۆتایی پێ دێت ؛ وە هیچ بەڵگەیەك نیە کە دروست نەبێت لەم حالەتەدا ئافرەت لەمزگەوت نوێژی مردووی لەسەر بکرێت .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن ابراهیم – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**38_ ئەگەر ئافرەت نوێژی جومعەی لەمزگەوت کرد ئایە نوێژی نیوەرۆی لەسەر لادەچێت ؟**

_ **وەڵام** ئەگەر ئافرەت نوێژی جومعەی لەمزگەوت لەگەڵ ئیمام کرد ئەوا نوێژی نیوەڕۆی لەسەر نامێنێت و نابێت نوێژی نیوەڕۆشی بەدوادا بکات ؛ بەڵام ئەگەر ڕۆژی جومعە لەماڵەوە بوو نەچوو بۆ مزگەوت ئەوکات دەبێت نوێژی نیوەڕۆ بکات و نابێت نوێژی جومعە بکات .

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە – ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**39_ ئایە حوکمی نوێژی جومعە بۆ ئافرەتان چیە ؛ وە ئایە ئەگەر ڕۆژی جومعە نەچوو بۆ مزگەوت لە چ کاتێکدا نوێژی نیوەڕۆی بکات ؟**

_ **وەڵام** : نوێژی جومعە لەسەر ئافرەتان واجب نیە ؛ بەڵام ئەگەر بچێت بۆ مزگەوت نوێژی جومعە لەگەڵ ئیمام بکات نوێژەکەی دروستە ؛ وە ئەگەر لەماڵەوە نوێژی کرد ئەوا دەبێت نوێژی نیوەڕۆ بکات چوار ڕکەعەت ؛ وە دەبێت نوێژەکەی لەکاتی بانگی نیوەڕۆ بکات ئەوکاتەی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لادەدات .

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە – ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**40_ ئایە حوکمی نوێژ کردن و ڕۆژوو گرتن بۆ ئافرەت لەکاتی بێ نوێژیدا چیە ؟**

_ **وەڵام** : ئافرەت لەکاتی بێ نوێژیدا – لەکاتی سووری مانگانەدا – نابێت نوێژبکات وە نابێت ڕۆژوو بگرێت ؛ وە لەدوای پاك بوونەوە و خۆش شوشتن گێڕانەوەی نوێژەکانی لەسەر نیە بەڵام گرتنەوەی ڕۆژوەکانی مانگی ڕەمەزانی لەسەرە ؛ بە بەڵگەی فەرمودەی دایکە عائیشە - ڕەزای خوای لێبێت – کە فەرمویەتی : ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – فەرمانمان پێ دەکرا بە گرتنەوەی ڕۆژوەکانمان بەڵام فەرمانمان پێ نەدەکرا بە گێڕانەوەی نوێژەکانمان .

وە حیکمەت لە نەگێرانەوەی نوێژەکان بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە نوێژ دوبارە دەبێتەوە و گێڕانەوەی لەسەر ئافرەتان قوڕس و گران دەبێت بە پێچەوانەی ڕۆژوو .

**لەلایەن زانای پایەبەر شێخ صالح الفوزان – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**41_ئایە دروستە ئافرەت مێردی  خۆی بشوات کاتێك دەمرێت ؟**

_ **وەڵام** : بەڵێ دروستە و ئاساییە ؛ ئەبو بەکری صدیق – رەزای خوای لێبێت – پێش بمرێت وەسیەتی کرد کە خێزانی بیشوات ؛ خێزانەکەی وەسیەتەکیە جێ بەجێ کرد ؛ وە بۆ پیاویش دروستە خێزانەکەی بشوات ؛ عەلی کوڕی ئەبو طالب – ڕەزای خوای لێبێت – فاتیمە خێزانی شوشت لەدوای مردنی – ڕەزای خوای پەروەردگاریان لێبێت - .

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەزای خوای پەروەردگاریان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**42_ئایە دروستە ئافرەت لەکاتی بێ نوێژیدا ئافرەتی مردوو بشوات ؟**

_ **وەڵام** : بەڵێ دروستە ئافرەت لەکاتی بێ نوێژیدا ئافرەتی مردوو بشوات و کەفنی بکات ؛ بێ نوێژی نابێتە ڕێگر لەشوشتنی مردوو .

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەزای خوای پەروەردگاریان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**43 _ ئایە دروستە پیاو ئافرەتی مردوو بشوات ؟**

_ **وەڵام** : دروست نیە  پیاو ئافرەتی مردوو بشوات تەنها ژنی نەبێت ؛ وە نابێت ئافرەت پیاوی مردوو بشوات تەنها مێردی  نەبێت .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ صالح الفوزان – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**44_ ئایە تاوانی ئەو ئافرەتانە چیە کاتێك لەسەر مردوو شین و ڕۆرۆدەکەن و پۆشاکیان دەدڕن ؟**

_ **وەڵام** : حەڕامە و دروست نیە ئافرەت لەسەر مردوو شین و ڕۆڕۆ بکات و دەنگی بەرز بکاتەوە و پۆشاکی بدڕێت و ڕوخساری بڕنێت و قژی دەربێنێت ؛ پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – خۆی لەم جۆرە ئافرەتانە بەری کردووە ؛ وە نەفرەتی لێ کردوون ؛ وە لەرۆژی دواییدا پۆشاکی ئاگرینیان لەبەر دەکرێت ئەگەر تەوبە نەکەن و واز لەم کارە ناشەرعیە نەهێنن .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ صالح الفوزان – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**45_ ئایە بۆ ئافرەتان دروستە لەگەڵ پیاوان بە جەماعەت نوێژی مردوو بکات ؟**

_ **وەڵام** : بەلێ دروستە بەڵام دەبێت لەڕیزی دواوە بوەستن .

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەزای خوای پەروەردگاریان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**46_ ئایە زەکات لە زێری ئافرەت دەکەوێت ئەو زێڕەی خۆی پێ دەڕازێنێتەوە ؟**

_ **وەڵام** : بەڵێ ئەو زێڕەی ئافرەت لەبەری دەکات و خۆی پێ دەڕازێنێتەوە زەکاتی لێ دەکەوێت ؛ لەفەرمودەیەکی سەحیحدا هاتووە ئافرەتێك دێتە لای پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – دووبازنەی زێر لەدەستی کچەیدا بووە ؛ پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – بەم ئافرەتە دەڵێت ئایە زەکاتی ئەم دووبازنەیە

دەدەی ؟ ئافرەتەکە وتی : نەخێر ؛ پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – پێی فەرموو : ئایە پێت خۆشە لەرۆژی دواییدا خوای پەروەردگار  بۆت بکات بە دووبازنی ئاگر ؟ ئافرەتەکە هەردوو بازنەکە لەدەستی کچەکەی دەکات و ئەفەرموێت : ئەم دوو بازنەیە با لەپێناوخواو گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری خوا بێت – صلى الله عليه وسلم - .

ئەم فەرمودەیە بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە ئافرەت دەبێت زەکات لەو زێرە بدات کە لەبەری دەکات بەمەرجێگ گەییشتبێت بە حەددی زەکات وە ساڵێکی بەسەردا سوڕابێتەوە .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزيز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**47_ ئایە دروستە ئافرەت زەکاتی زێری  بدات بە مێردەکەی ئەگەر مێردەکەی هەژاربێت و قەرزداربێت ؟**

_ **وەڵام** : دروستە ئافرەت زەکاتی زێری یان زەکاتی پارەی بدات بە مێردەکەی ئەگەر مێردەکەی هەژاربێت یان قەرزداربێت  _ چونکە لەسەر ئافرەت واجب نیە مێردەکەی بەخێوبکات و مەسرەفی بکات بەڵام دروست نیە مێرد زەکاتی بدات بەخێزانەکەی چونکە لەسەری واجبە بەخێوی بکات و مەسرەفی بکات _ .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزيز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**48_ ئایە دروستە زەکات بدرێت بەدایك ؟**

_ **وەڵام** : دروست نیە زەکات بدرێت بەدایك یان باوك ؛ بەڵکو واجبە بەبێ زەکات

دایك و باوك بەخێو بكرێن و یارمەتی بدرێن و بێ پێویست بكرێن .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**49_ ئایە دروستە باوك یان دایك زەكات بدات بە كچەكەی ؟**

_ **وەڵام** : ئەگەر باوك یان دایك نەیتوانی بەبێ زەكات كچەكەی و منداڵەكانی كچەی بەخێوبكات ئەوكات دروستە زەكاتیان پێ بدات ؛ وە باشتروایە زەكاتە بدات بە مێردی كچەكەی .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**50_ ئایە دروستە برا زەكات بدات بە خوشك ؟**

_ **وەڵام** : دروستە برا زەكات بدات بە خوشكەكەی ئەگەر خوشكەكەی هەژاربێت و مێردی خوشكەكەی نەتوانێت بەتەواوی مەسرەفیان بكات .

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە – ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**51_ ئایە زەكات لەمارەیی ( مؤخرة ) دەكەوێت – ئەو بەشە مارەییەی دواخراوە و بۆ ئافرەتەكە نەكراوە - ؟**

_ **وەڵام** : ئەگەر مێردی ئافرەتەكە هەژاربێت و توانای كردنی ئەو مارەییەی نەبێت ئەوا لەسەر خێزانەكەی واجب نیە زەكاتی لێ بدات ؛ وە هەروەها زەكات لەپارەی قەرزیش بەهەمان شێوە ئەگەر كەسێك پارەی لەلای كەسێكی هەژاربێت و ئەم

کەسە هەژارە نەتوانێت پارەکە بگەرێنێتەوە ئەوا لەسەر خاوەن پارەکە واجب نیە زەکات لەم پارەیە بدات هەتا ئەوکاتەی بۆی دەگەڕێتەوە ؛ بەڵام ئەگەر کەسە قەرزدارەکە بتوانێت قەرزەکە بگەڕێنێتەوە ئەوا لەسەر خاوەن پارەکە واجبە زەکات لەو پارەیەی بدات کە لەقەرزە .

**لەلایەن زانای پایەبەر شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**52_ ئەگەر ئافرەت مارەیی پێ نەدرابێت پاشان دوای چەند ساڵێك پێی بدرێت ئایە چۆن زەکات لەم مارەییەی بدات ؟**

_ **وەڵام** : ئەگەر مێردەکەی کەسێکی دەوڵەمەند بوبێت ئەوا دەبێت زەکاتی هەموو ساڵەکانی بدات ؛ وە ئەگەر مێردەکەی کەسێکی هەژاربوبێت یان دەستی بەسەر مارەییەکەی داگرتبوبێت و خێزانەکەی ئومێدی وەرگرتنی ئەم مارەییەی نەبوبێت ئەوکات تەنها زەکاتی یەك ساڵی لێ دەدات .

**لەلایەن زانای پایەبەر شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**53_ ئەگەر ئافرەتێك لەتەمەنی 13 ساڵی مانگێك پیش مانگی رەمەزان بالغ بێت و بەرۆژوو نەبێت ئایە گرتنەوەی رۆژووەکانی لەسەرە ؟**

_ **وەڵام** : واجبە لەسەر ئەم ئافرەتە گشت رۆژووەکانی بگرێتەوە چونکە ئەوکات بالغ بووە و رۆژووی مانگی رەمەزانی لەسەر فەرز بووە ؛ وە پێویستە داوای لێ خۆشبوون لەخوای پەروەردگار بکات .

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**54_ ئەگەر ئافرەت لەکاتی بەرۆژووبوون پێش ئەوەی خۆرئاوابێت بە چەند خولەکێکی کەم تووشی بێ نوێژی ببێت ئایە ڕۆژووەی بەتاڵ دەبێتەوە ؟**

**_ وەڵام : ئەگەر پێش خۆرئاوابوون تووشی بێ نوێژی بوو ئەوکات ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و دەبێت دوای ڕەمەزان بیگرێتەوە ؛ بەڵام ئەگەر دوای خۆرئاوابوون تووشی بێ نوێژی بوو ئەوا ڕۆژوەکەی دروستە و گرتنەوەی لەسەرنیە .**

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت - وەڵام دراوەتەوە .**

**55_ ئەگەر ئافرەت لەمانگی ڕەمەزان پێش بانگی بەیانی لەبێ نوێژی پاك بێتەوە و خۆشوشتنەکەی دوابخات بۆ دوای بانگی بەیانی ئایە رۆژوەکەی دروستە ؟**

**_ وەڵام : بەڵێ ڕۆژوەکەی دروستە چونکە پێش بانگی بەیانی پاك بۆتەوە و وەك ئەوکەسە وایە کەپێش بانگی بەیانی لەشگران بێت و خۆشوشتنەکەی دوا دەخات بۆ دوای بانگی بەیانی ؛ ڕۆژووی ئەم جۆرە کەسانە دروستە و ئاساییە .**

**لەلایەن زانای پایەبەر شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**56_ ئایە دروستە ئافرەت لەکاتی بەرۆژووبوون کل دەچاوەکانی بکات ؟**

**_ وەڵام : قەولی ڕاست و دروست کل ڕۆژوو ناشکێنێت ؛ بەڵام بەشەو بەکاری بێنێت باشترە .**

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**57_ ئایە خەنە دەبێتە ڕێگر لە دروست نیەتی دەست نوێژ**

_ **وەڵام** : نەخێر خەنە نابێتە ڕێگر لە دروست تیەتی دەست نوێژ ؛ چونکە خەنە جەستەی نیە و تەنها ڕەنگە ڕێگری لەگەییشتنی ئاو ناکات بە ئەندامەکانی دەست نوێژ .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**58_ هەندێك لە ئافرەتان ڕەمەزانی دوەمیان بەسەردادێت کەچی ڕۆژوە قەرزەکانی ڕەمەزانی تریان نەگرتۆتەوە ئایە چیان لەسەر واجبە ؟**

_ **وەڵام** : سەرەتا واجبە لەسەریان تەوبە بکەن و داوای لێ خۆشبوون لەخوای گەورە بکەن ؛ چونکە دروست نیە بەبێ عوزر قەرزەکانیان دوا بخەن بۆ دوای ڕەمەزانی ساڵی دواتر ؛ وە دەبێت ڕۆژووەکانیان بگرنەوە .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**59_ ئایە بۆچی ئافرەت لەدوای پاك بوونەوە لەبێ نوێژی دەبێت ڕۆژوە فەڕزەکانی بگرێتەوە بەڵام گێرانەوەی نوێژە فەڕزەکانی لەسەر نیە ؟**

_ **وەڵام** : بێگومان نوێژە فەڕزەکان لەماوەی شەو ڕۆژدا دوبارە دەبەنەوە و بەسەریەکدا زۆر دەبن و گێرانەوەیان لەسەر ئافرەت قورس و گران دەبێت بەڵام ڕۆژوو وانیە ؛ خوای پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی : خوا ئاسانکاری بۆ ئێوە دەوێت نەك قورسی و ناخۆشی .

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

60_ ئایە حوکمی ڕۆژووی سوننەت چیە بۆ ئافرەتی بەمێرد

_ وەڵام : بۆ ئافرەتی خاوەن مێرد ئەوکاتەی مێردەکەی لەماڵەوەیە دروست نیە بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی ڕۆژووی سوننەت بگرێت ؛ لەبەر پێویستی مێردەکەی پێی لەڕووی چێژلێ وەرگرتنەوە ؛ بەڵام ئەگەر مێردەکەی ڕێگەی پێ بدات ئەوا دروستە و ئاساییە رۆژووی سوننەت بگرێت ؛ یان ئەوکاتەی مێردەکەی لەسەفەرە و لەماڵەوە نیە ئەوکاتیش بۆی دروستە و ئاساییە .

للایەن زانای پایەبەرز شێخ صالح الفوزان – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

61_ ئایە دروستە ئافرەت بەبێ مەحرەم لەگەڵ کۆمەڵە ئافرەتێکی باش بچێت بۆ حەج ؟

_ وەڵام : قەولی راست و دروست بۆ ئافرەت دروست نیە بچێت بۆ حەج ئیلا لەگەڵ پیاوێکی مەحرەمی نەبێت ؛ ئەگەر هیچ پیاوێکی مەحرەمی دەست نەکەوت ئەوکات حەجی لەسەر واجب نابێت بەهۆی نەبوونی مەحرەم .

للایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

62_ ئایە ئەو ئافرەتەی بەبێ مەحرەم حەجی کردووە حەجەکەی بەتاڵ دەبێتەوە ؟

_ وەڵام : نەخێر حەجەکەی بەتاڵ نابێتەوە بەڵام گوناهی رۆیشتنی بەبێ مەحرەم لەسەر دەنوسرێت و پێویستە داوای لێ خۆشبوون لەخوای پەروەردگار بکات .

للایەن زانای پایەبەرز شێخ ئەلبانی – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**63_ئایە دروستە ئافرەت بەردە رەشەکە ماچ بکات ؛ وە نوێژ لەدوای مەقامی ابراهیم بکات ؟**

_ **وەڵام** : ئەگەر زۆر قەڵەباڵغی بوو و مەترسی بەرکەوتنی پیاوانی نامەحرەمی هەبوو نابێت ئەم کارە بکات و دەبێت خۆی بپارێزێت .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن ابراهیم – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**64_ئایە بەهەڵوەر ڕۆییشتن لەسێ تەوافی یەکەم بەدەوری کەعبەدا تایبەتە بە پیاوان یان بۆ ئافرەتانیش دروستە ؟**

_ **وەڵام** : ئەم جۆرە رۆییشتنە لەسێ تەوافی سەرەتادا تایبەتە بە پیاوان و بۆ ئافرەتان سوننەت نیە بەم شێوەیە ئەم سێ تەوافە بکەن .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**65_ئایە بۆ ئافرەتان دروستە لەکاتی سەفا و مەرەوەدا لەنێوان دوو ئالا سەوزەکەدا وەك پیاوان ڕابکەن ؟**

_ **وەڵام** : نەخێر ئافرەتان نابێت وەکو پیاوان لەنێوان ئەم دوو ئلایەدا بەخێرایی و ڕاکردن بڕۆن – ئەم جۆرە ڕۆییشتنە لەنێوان ئەم دوو ئلایەدا بۆ پیاوان سوننەتە و واجب نیە - بۆیە ئەو پیاوانەی ئافرەتیان لەگەڵە پێویستە لەگەڵ ئافرەتەکانیان بڕۆن بەخێرا نەڕۆن و ڕەچاوی ئافرەتەکانیان بکەن .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**66_ئایە دروستە بۆ ئافرەت لەکاتی حەج و عومرە سەری بتاشێت ؟**

_ **وەڵام** : نەخێر دروست نیە ئافرەت لەکاتی حەج و عومرەدا پرچی بتاشێت ؛ بەڵکو تەنها بەئەندازەی سەرە پەنجەیەك پرچی کورت دەکاتەوە ؛ پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم – فەرمویەتی : لەسەر ئافرەتان نیە سەریان بتاشن بەڵکو تەنها کورتکردنەوەی پرچیان لەسەرە .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ صالح الفوزان – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**67_ئایە هیچ جۆرە پۆشاکێکی تایبەت هەیە بۆ ئافرەتان لەکاتی حەج و عومرەدا ؟**

_ **وەڵام** : نەخێر هیچ جۆرە پۆشاکێکی تایبەت و دیاری کراو نیە بۆ ئافرەتان لەکاتی حەج و عومەرەدا لەبەری بکات ؛ بەڵکو هەر پۆشاکە شەرعیەکەی خۆی لەبەر دەکات کە هەموو لاشەی داپپۆشێت ؛ وە ڕازاوە و سەرنج ڕاکێش نەبێت .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ صالح الفوزان – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**68_ئایە دروستە ئافرەت لەکاتی حەج و عومرەدا دەستەوانە و گۆرەوی لەبەربکات ؟**

_ **وەڵام** : بۆ ئافرەت دروستە لەکاتی حەج و عومرەدا گۆرەوی لەپێ بکات ؛ بەڵام

نابێت دەستەوانە لەدەست بکات پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم : نەهی کردووە ئافرەت لەکاتی ئیحرامدا دەستەوانە لەدەست بکات .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثيمين – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**69_ئایە دروستە ئافرەت حەج بۆ دایکی خۆی بکات ؟**

_ وەڵام : هەر ئافرەتێك خۆی حەجی کردبێت دروستە حەج بۆدایکی یان بۆ هەرکەسێکی تر بکات .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن إبراهيم – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**70_ئایە دروستە ئافرەت ئاژەڵ سەرببڕێت ؟ وە حوکمی گۆشتی سەربڕاوی دەستی ئافرەت چیە ؟**

_ وەڵام : دروستە و ئاساییە ئافرەت ئاژەڵ سەرببڕێت ؛ وە دروستە لەگۆشتی سەربراوی دەستی بوخرێت ئەگەر ئافرەتەکە موسڵمان بێت یان ئەهلی کیتاب بێت ؛ وە بەشێوەیەکی شەرعی سەری ئاژەڵەکە ببڕێت .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزيز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**71_ئایە دروستە بۆ ئافرەت لەکاتی ئیحرامی حەج و عومرەدا بازنەی زێڕی لەدەست بێت ؟**

_ وەڵام : ئاساییە ئافرەت لەکاتی ئیحرامدا بازنەی زێر لەدەست بکات بەمەرجێك لەپیاوانی نامەحرەم دایبپۆشێت .

للایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

72_ ئایە دروستە ئافرەتی بێ باوك بەبێ پرس پێ كردن براكەی بەشووی بدات ؟

_ وەڵام : دروست نیە ئافرەتی بی باوەك بێ ئەوەی پرسی پێ بكرێت للایەن براكەیەوە بەشوو بدرێت ؛ بەڵكو دەبێت خۆی ڕازیبێت ئەوكات دروستە ئەگەرنا دروست نیە و تاوانە .

للایەن زانای پایەبەرز عبدالرحمن السعدي – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

73_ ئایە دروستە ئافرەت بەبێ ئیزنی باوكی شوو بكات ؟

_ وەڵام : نەخێر دروست نیە ئافرەت بەبێ ئیزنی باوكی شوو بكات چونكە باوكی وەلی ئەوە ؛ باوكی باشتر دەزانێت كێ بۆ ئەو باشە ؛ وە بۆ باوكیش دروست نیە ڕێگربێت لەشوو كردنی كچەكەی بەكەسێكی چاك و هاوشێوەی .

للایەن زانای پایەبەرز شێخ صالح الفوزان – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

74_ ئایە كێ دەبێت بە وەلی ئافرەت لەكاتی گرێبەستی هاوسەرگیریدا ؟

_ وەڵام : باوك لەهەموو كەس لەپێشترە بۆ ئافرەت كە ببێت بەوەلی لەكاتی

گرێبەستی هاوسەرگیریدا ؛ پاشان باپیری وە بەرەو سەرەوە ؛ پاشان برا وە بەرەو خوارەوە ؛ پاشان مام ؛ پاشان کە کەس نەبوو حاکم دەبێت بەوەلی .

لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە – ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

_75 ئایە دروستە لەکاتی پرۆسەی هاوسەرگیریدا ئافرەتان دەف لێ بدەن ؟

_ وەڵام : سوننەتە ئافرەتان لەکاتی پرۆسەی هاوسەرگیریدا دەف لێ بدەن بەمەرجێك لەگەڵ پیاوانی نامەحرەم تێ کەڵ نەبن ؛ وە نابێت لەگەل دەف لێدان ئالەتە مۆسیقیەکان بەکاربهێنن ؛ وە دروستە سروود بڵێن بەمەرجێك پیاوانی نامەحرەم نەیبیستن و تێکەڵیان نەکەن .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ صالح الفوزان – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

_76 ئایە کەفارەتی سەرجێی کردن لەگەڵ خێزان لەکاتی بێ نوێژیدا چیە ؟

_ وەڵام : هەرپیاوێك لەکاتی بێ نوێژی خێزانەکەیدا بچێتە لای خێزانی واجبە یەك مسقاڵ زێر یان نیو مسقاڵ زێر بدات بە هەژاران و بیکات بەکەفارەتی ئەم تاوانەی ؛ ئەم حوکمە لەهاوەڵی بەڕێز عبداللە ی کوڕی عەبباس – ڕەزای خوای لێبێت – ڕیوایەتکراوە .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالرحمن سەعدی – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

_77 ئایە حوکمی چوونە لای خێزان لەڕێگای کۆمەوە چیە ؟

_ وەڵام : دروست نیە پیاو لەڕێگای كۆمەوە بچێتە لای خێزانی ؛ ئەم كارە حەڕامە و لەتاوانە گەورەكانە ؛ پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – فەرمویەتی :
مەلعونە ئەوكەسەی لەڕێگای كۆمەوە دەچێتە لای خێزانی .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

## 78_ئایە دروستە ئافرەت كرێی ئامادەكردنی خواردن لەماڵەوە لەمێردەكەی وەربگرێت ؟

_ وەڵام : لەسەر ئافرەت واجبە ئەو كارانەی ماڵەوە جێ بەجێ بكات كە عادەتی ئافرەتانی وڵاتەكەیەتی و جێ بەجێی دەكەن ؛ چونكە ئەوكارانەی ئافرەتان لەماڵەوە دەیكەن و تایبەتە بەوان وەك مەرج وایە و دەبێت جێ بەجێ بكرێت .

لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە – ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

## 79_ئایە دروستە ئافرەت حەبی مەنعی دووگیانی بخوات ؟

_ وەڵام : نەخێر بەبێ عوزری شەرعی دروست نیە ئافرەت حەبی مەنعی دووگیانی بخوات ؛ چونكە پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – هانی موسڵمانانی داوە منداڵی زۆریان ببێت ؛ بەڵام ئەگەر بۆ ئافرەتێك دووگیانی زیانی هەبوو بەهۆی نەخۆشی رەحم یان منداڵی زۆری بەدوای یەكدا ببوو و دووگیانی زیانی بۆی هەبێت ئەوكات دروستە ڕێگری لەدووگیانی بكات هەتا ئەوكاتەی عوزری نامێنێت .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**80_ ئایە دروستە ئافرەت گوێڕایەڵی مێردەکەی نەکات و بەبێ ئیزنی مێردەکەی لەماڵەوە بچێتە دەرەوە ؟**

_ وەڵام : لەسەر ئافرەت واجبە لەکاری چاکدا گوێڕایەڵی مێردەکەی بکات ؛ وە حەڕامە لەسەری لەکاری خراپدا گوێڕایەڵی مێردەکەی بکات ؛ وە بۆی دروست نیە بەبێ ئیزنی مێردەکەی لەماڵەوە بچێتە دەرەوە ؛ پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – فەرمویەتی : ئەگەر پیاو داوای سەرجێی لەخێزانەکەی کرد بەڵام خێزانی وەڵامی نەدایەوە و گوێڕایەڵی نەکرد ؛ پاشان پیاوەکە بەتووڕەبوونەوە بخەوێت ؛ ئەوا فریشتەکان هەتا بەیانی نەفرەت لەم ئافرەتە دەکەن .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ صالح الفوزان – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**81_ ئەگەر ئافرەتێك لە مێردەکەی تووڕەبێت و پێی بڵێت تۆ وەك باوکم لەمن حەڕام بی ! ئایە کەفارەتی چیە ؟**

_ وەڵام : ئەگەر ئافرەت بەمێردی بڵێت تۆ لەمن حەرام بی ؛ ئەوا دەبێت داوای لێ خۆشبوون لەخوای پەروەردگار بکات ؛ وە کەفارەتی سوێند بدات کە بریتیە لە خواردنی 10 هەژار یان پۆشاکیان پێ بدات یان کۆیلەیەك ئازادبکات ؛ ئەگەریان نەیتوانی هیچ کام لەوانە ئەنجام بدات ئەوکات دەبێت 3 ڕۆژ بەرۆژووبێت .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزيز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**82_ئایە ئەو ژن و مێردانە لەلای خەڵك باسی سەرجێی کردنی یەکتر دەکەن تاچەند تاوانبارن ؟**

_ **وەڵام** : هەرپیاوێك یان هەرئافرەتێك لەلای خەڵك باسی سەرجێی یەکتربکەن ئەوا تووشی تاوانێکی زۆر گەورەبوونە و پێویستە داوای لێ خۆشبوون لەخوای گەورە بکەن و جارێکی تر ئەم کارە نهێنیەی نێوانیان لەلای خەڵك باس نەکەن و ئاشکرا نەکەن ؛ پێغەمبەری خوا – صلى الله علیه وسلم – فەرمویەتی : خراپترینی خەڵکی ئەو پیاوەیە کاتێك دەچێتە لای خێزانی و سەرجێی لەگەڵ دەکات پاشان دەچێت لەلای خەڵکی باس دەکات ! .

بێگومان ئەم فەرمودەیە ئەو جۆرە ئافرەتانەش دەگرێتەوە کاتێك دەچن لەلای خەڵکی باسی سەرجێی نێوان خۆی مێردەکەیان دەکەن !

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن ابراهیم – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**83_ئەگەر ئافرەتێك پیاوەکەی بۆ ماوەی چەند ساڵێك ون بوو و نەدۆزرایەوە ؛ پاشان ئەم ئافرەتە شووی بەپیاوێکی تر کرد ؛ پاشان دوای ماوەیەك پیاوی یەکەمی گەڕایەوە ؛ ئایە ئەم ئافرەتە بۆ کام لەم دووپیاوە دەبێت ؟**

**وەڵام** : ئەگەر ئافرەتێك پیاوەکەی ونبوو و حوکمی مردنی بۆ درا پاشان ئەم ئافرەتە دوای ( عیددە ) شووی بەپیاوێکی تر کرد ؛ پاشان دوای ماوەیەك پیاوە ونبوەکەی گەڕایەوە ؛ ئەوکات ئەم پیاوە بۆی هەیە خێزانەکەی خۆی بوێتەوە و بیگەڕێنێتەوە وە بۆی هەیە نەیگەڕێنێتەوە ؛ جا ئەگەر خێزانەکەی ویستەوە و گەڕاندیەوە پێویست بەوە ناکات دووبارە مارەی بکاتەوە بەڵام نابێت سەرجێی لەگەڵ بکات هەتا عیددەی لەپیاوی دووەم تەواو دەبێت .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە**

!

**84_ئایە دروستە ئافرەت هاوسەرگیری لەگەڵ مێردی پووری بکات لەکاتێکدا پووری هێشتا لەژیاندابێت ؟**

**_ وەڵام : نەخێر دروست نیە و نابێت ئافرەت هاوسەرگیری لەگەڵ مێردی پووری بکات ئەوکاتەی پووری لەژیاندایەوە ؛ پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – فەرمویەتی : نابێت پیاو ئافرەتێك مارە بکات کە خیزانی دەکاتە پووری ئەم ئافرەتە .**

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**85_ ئایە دروستە ئافرەت بەبێ عوزری شەرعی داوای تەڵاق لەمێردەکەی بکات ؟**

**_ وەڵام : نەخێر دروست نیە و حەڕامە و نابێت ئافرەت بەبێ عوزری شەرعی داوای تەڵاق لەمێردەکەی بکات ؛ پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – فەرمویەتی : هەر ئافرەتێك بەبێ عوزری شەرعی داوای تەڵاق لەمێردەکەی بکات بۆنی بەهەشتی لێ حەڕام دەبێت .**

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ صالح الفوزان – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**86_ئایە ئەو ئافرەتەی مێردی دەمرێت هەتا کەی نابێت شوو بکاتەوە ؟**

**_ وەڵام : ماوەی شوو نەکردنی ئافرەت لەدوای مردنی مێردەکەی دوو حالەتی هەیە :**

**حالەتی یەکەمیان : ئەگەر ئافرەتەکە دووگیان بوو ئەوا هەرکاتێك کۆرپەلەکەی دانا**

ئەوكات بۆی دروستە شوو بكاتەوە .

**حالەتی دووەمیان :** ئەگەر ئافرەتەكە دووگیان نەبوو ئەوكات ماوەی 4 مانگ و دە ڕۆژ دەبێت بوەستێت و نابێت شوو نەكاتەوە .

وە لەوماوەیەدا دەبێت لەمالی مێردەكەی دابنیشێت و نابێت بەبێ پێویست بچێتە دەرەوە هەتا ماوەكەی تەواو دەبێت ؛ وە نابێت خۆی برازێنێتەوە بە لەبەركردنی پۆشاكی جوان و بۆن لەخۆدان و كل دەچاو كردن و بۆیە كردنی قژ و خەناوكە و بازنە لەدەست كردن .

**للایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

## 87_ ئایە تایبەت كردنی پۆشاكی ڕەش بۆ تەعزیە دروستە ؟

_ **وەڵام :** لەبەر كردنی پۆشاكی ڕەش بۆ تەعزیە هیچ بەڵگەیەكی لەبارەوە نەهاتووە بۆیە تایبەت كردنی پۆشاكی رەش بۆ تەعزیە كارێكی خراپە و دروست نیە .

**للایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

## 88_ ئایە بە چ بەڵگەیەك باڵاپۆشی لەسەر ئافرەتان واجبە ؟

_ **وەڵام :** خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی : ( يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ) . الاحزاب : 59 .

**واتە :** ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە هاوسەرانت و بە كچانت و بە

ئافرەتانی بڕواداران بڵێ با عاباكانیان بدەن بەسەر خۆیاندا و (سەر و لاشەیان (داپۆشن ) ئەوە نزیكترە بناسرێن (بە داوێن پاك) تا بەهۆیەوە ئازار نەدرێن .

وە فەرمویەتی : ( وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ ) . النور : 31 .

واتە : با سەرپۆشەكانیان بدەن بە سینگ و بەرۆكیاندا ؛ وە جوانی خۆیان دەرنەخەن .

89_ ئایە حوكمی باڵاپۆشی بۆ ئەوكچانە چیە كە هێشتا بالغ نەبوونە ؟

_ وەڵام : لەسەر دایكان و باوكان واجبە فەرمان بە كچەكانیان بكەن پۆشاكی شەرعی لەبەر بكەن ئەگەر هێشتا بالغیش نەبووبن بۆ ئەوەی فێرببن و ڕابێن و تووشی فیتنە و ڕەوشتی نزم و بڵاو كردنەوەی خراپەكاری نەبن .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ابن باز - ڕەحمەتی خوای لێبێت - وەڵام دراوەتەوە .

90_ ئایە دروستە ئافرەت پۆشاكی تایبەت بە پیاوان لەبەر بكات ؟

_ وەڵام : بۆئافرەت دروست نیە پۆشاكی تایبەت بەپیاوان لەبەر بكات ؛ پێغەمبەری خوا - صلى الله علیه وسلم - نەفرەتی كردووە لەو ئافرەتانەی پیاوان لەبەر دەكەن ؛ وە نەفرەتی كردووە لەوپیاوانەی پۆشاكی ئافرەتان لەبەر دەكەن .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ صالح الفوزان - ڕەحمەتی خوای لێبێت - وەڵام دراوەتەوە .

**91_ئایە دروستە ئافرەت مووی برۆ و سمێڵ و ڕیش و مووی دەست و قاچی بکات ؟**

_ **وەڵام** : برۆکردن حەرامە و دروست نیە چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەعنەتی لەوجۆرە ئافرەتانە کردووە کە مووی برۆیان دەکەن ؛ بەڵام لادانی مووی سمێڵ و ریش و دەست و قاچ بۆ ئافرەت دروستە و ئاساییە .

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**92_ئایە ئەگەر ئافرەتێك مووی برۆیەکانی گەلێك زۆر بوو دروستە کەمێك دەستکاری بکات و لاییەرێت ؟**

_ **وەڵام** : لەئەسڵدا برۆکردن دروستە نیە بەڵام ئەگەر ئافرەتێك مووی برۆیەکانی گەلێك زۆربوو بەشێوەیەك هاتبووە ناو چاوەکانی و کاریگەری لەبینینی دەکرد ئەوکات بۆی دروستە ئەوەندە لابەرێت کە پێی نارەحەتە .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**93_ئایە حوکمی خاڵ کوتان وتاتۆ کردن چیە ؟**

_ **وەڵام** : خاڵ کوتان و تاتۆکردن دروست نیە و حەڕامە ؛ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی : خوا نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی خاڵ دەکوتن و تاتۆ دەکەن – وە بێگومان ئەم حوکمە پیاوانیش دەگرێتەوە - .

**لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**94_ ئایە دروستە ئافرەت باڕوکە - پرچی صناعی لەسەر بنێت - ؟**

_ **وەڵام** : ئەگەر ئافرەت چرچی خۆی هەبێت ئەوا دروست نیە پرچی صناعی پێوە بلکێنێت و باڕوکە لەسەر بنێت چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەفرەتی لەم جۆرە ئافرەتانە کردووە ؛ بەڵام ئەگەر ئافرەتێك پرچی نەمابێت بۆ ئەو دروستە ئەم باڕوکەیە لەسەر بنێت بۆ ئەوەی ئەم عەیەبی پێ داپۆشێت .

**للایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثيمين – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**95_ ئایە دروستە ئافرەت پرچی سەری بتاشێت ؟**

_ **وەڵام** : نەخێر دروست نیە بەڵام لەکاتی پێویست دروستە ؛ بۆ نمونە ئەگەر نەخۆش بێت یان سەری شکابێت و پێویست بێت بدروێتەوە لەوکات دروستە و ئاساییە .

**للایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**96_ ئایە دروستە ئافرەت پرچی لەسەر سەری کۆبکاتەوە ؟**

_ **وەڵام** : کۆکردنەوەی پرچ لەسەر سەر دروست نیە و حەڕامە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی : ئەو ئافرەتانەی پۆشاکی تەنك و رووت و تەسك لەبەر دەکەن وە پرچیان لەسەر سەریان کۆدەکەنەوە بۆنی بەهەشت ناکەن و ناچنە بەهەشت .

بەڵام کۆکردنەوەی پرچ لەسەر پشتە مل دروستە و ئاساییە بەڵام بۆ دەرەوە ئەگەر سەرنج راکیش بێت ئەوا دروست نیە و نابێت بۆ دەرەوە خۆی سەرنج ڕاکێش بکات .

**للایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثيمين – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

## 97_ ئایە دروستە ئافرەتان نینۆکیان درێژ بکەن

_ وەڵام : ئەگەر مەبەست لەم نینۆك درێژکردنە لاسایی کردنوەی ئافرەتانی بێ باوەربێت ئەوا دروست نیە و حەرامە بەڵام ئەگەر بەهۆی کەمتەرخەمیەوە نینۆکی بۆماوەی زیاتر لەچل رۆژ نەکات ئەوا مەکروهە و پێچەوانەی ئەوکاتەی کردووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ ئوممەتەکەی داناوە بۆ نینۆك کردنیان .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

## 98_ ئایە دروستە ئافرەت پێلاوی پاژنە بەرز – کعب العالي - لەبەر بکات ؟

_ وەڵام : لەبەر کردنی پێڵاوی کعب العالي دروست نیە چونکە هۆکاری بەربوونەوەی ئافرەتە و زیانی تەندروستی هەیە ؛ وە مرۆڤ لەشەرعدا فەرمانی پێ کراوە خۆی لەشتی زیان بەخش بپارێزێت ؛ وە ئەم جۆرە پێڵاوە هۆکارە بۆ دەرخستنی دواوە و لاشەی ئافرەت بەشێوەیەکی جیاواز کە ئەمەش بێگومان دروست نیە و تاوانە و سەرنجی پیاوانی نامەحرەم بۆلای خۆی ڕادەکێشێت .

لەلایەنی زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

## 99_ ئایە حوکمی خەتەنەکردن بۆ ئافرەتان چیە لەشەرع

_ وەڵام : خەتەنەکردن بۆ ئافرەتان سوننەتە بەڵام بۆ پیاوان واجبە .

لەلایەنی زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

## 100_ ئایە دروستە ئافرەت بە تەنها لەگەڵ خاوەن تەکسیەك هاتووچۆ بکات ؟

_ وەڵام : نەخێر دروست نیە و حەرامە ؛ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی : هیچ پیاوێکی نامەحرەم نیە بەتەنها لەگەڵ ئافرەتێك بمێنێتەوە ئیلا شەیتان سێیەمیان دەبێت .

مانەوەی ئافرەت لەگەڵ پیاوی ناحەرم لەناو سەیارەدا زۆر خراپ و مەترسیدارە بەشێوەیەك ئەم خاوەن سەیارەیە دەتوانێت ئەم ئافرەتە بۆ هەر شوێنێك بوێت ببات جا ئافرەتەکە ڕازیبێت یان ڕازی نەبێت !

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن ابراهیم - ڕەحمەتی خوای لێبێت - وەڵام دراوەتەوە .

## 101_ ئایە دروستە ئافرەت لەکاتی بێ نوێژیدا قوڕئان بخوێنێتەوە ؟

_ وەڵام : لەلایەن زانایاین ڕای جیاواز هەیە هەندێکیان بەدروستی نازانن وە هەندێکێیان بەدروستی دەزانن ؛ قەولی ڕاست و دروست والله أعلم ئەوەیە کە دروستە ئافرەت لەکاتی بێ نوێژیدا قورئان بخوێنێتەوە بەمەرجێك موسحەفی قورئان بەدەستەوە نەگرێت ؛ وە ئەگەر پێویستی کرد قورئان بەدەستەوە بگرێت ئەوا دەبێت بەدەست کێشێك قوڕئان بەدەستەوە بگرێت .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ابن باز - ڕەحمەتی خوای لێبێت - وەڵام دراوەتەوە .

**102_ ئایە کاتێك ئافرەت لەبێ نوێژی پاك دەبێتەوە واجبە پۆشاکەکانی بگۆڕێت لەکاتێکدا پۆشاکەکەی هیچ خوێن و پیسی بەرنەکەوتبێت ؟**

**_ وەڵام : نەخێر لەسەر ئافرەت واجب نیە پۆشاکەکەی بگۆڕێت ئەگەر هیچ خوێن و پیسی بەرنەکەوتبێت ؛ بەڵام ئەگەر پۆشاکەکەی خوێنی بەرکەوتبێت ئەوکات دەبێت بیشوات و پاکی بکاتەوە .**

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**103_ ئایە ئافرەت لە چ بوارێکدا دەتوانێت کار بکات و لەسنووری لەشەرع دەرنەچێت ؟**

**_ وەڵام : بۆ ئافرەت دروستە لەوبوارەدا کار بکات کە تایبەتە بە ئافرەتان ؛ وەك وانە وتنەوە بە ئافرەتان یان فێرکردنی کارە دەستیەکان وەك بەرگودوریەتی یان بوون بە پزیشکی تایبەت بە ئافرەتان ؛ یان هەرکارێکی تری تایبەت و پێویست بۆ ئافرەتان  بەڵام ئەو کارانەی کە تایبەتە بەپیاوان و هۆکاری تووش بوونی ئافرەتە بەتێکەڵ بونی لەگەڵ بەپیاوانی نامەحرەم و مانەوە بەتەنها لەگەڵیان ! ئەمەیان دروست نیە و سەردەکێشێت بۆ چەندین فیتنە و تاوان .**

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**104_ ئایە سنووری قسەکردنی ئافرەت لەگەڵ پیاوی نامەحرەم لەکاتی کرین و فرۆشتندا چۆنە ؟**

_ وەڵام : قسەكردنی ئافرەت لەگەڵ دوكاندار دروستە لەكاتی پێویستدا بەمەرجێك قسەكەردنەكەی پێكەنین و دەنگ ناسك كردنی لەگەڵدا نەبێت ؛ خوای پەروەردگار فەرمویەتی : ( فَلاَ تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ ) . الاحزاب : 32 .

واتة : بە نازەوە قسە مەكەن نەوەكو ئەوەی دڵی نەخۆشە نیازی خراپتان لێ بكات .

للایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثيمين – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

## 105_ئایە ڕاستە دەنگی ئافرەت عەوڕەتە ؟

_ وەڵام : دەنگی ئافرەت ئەگەر ناسكی و نازی لەگەڵ نەبێت عەوڕەت نیە چونكە ئافرەتان لەسەر دەمی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پرسیاری دینیان لە پێغەمبەری خوا كردووە صلى الله عليه وسلم وە هەروەرها پرسیاریان لە هاوەڵە بەڕێزەكان كردووە ؛ بەڵام ئەو دەنگەی كە دروست نیە و نابێت ئافرەت بەكاربیبێنێت ئەوەیە كە دەنگی خۆی ناسك و سەرنج ڕاكێش بكات ؛ خوای پەروەردگار فەرمویەتی : ( فَلاَ تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ ) . الاحزاب : 32 .

واتە : بە نازەوە قسە مەكەن نەوەكو ئەوەی دڵی نەخۆشە نیازی خراپتان لێ بكات .

لەلایەنی زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

## 106_ئایە دروستە پیاو تەوقە لەگەڵ ئافرەتان بكات ؟

_ وەڵام : تەوقە كردن لەگەڵ ئافرەتان دەبێت بەدووبەشەوە ؛ ئەگەر ئافرەتەكە مەحرەمی پیاوەكە بێت بۆ نمونە دایكی بێت یان كچی بێت یان خوشكی بێت یان

نەنگی بێت یان پووری بێت یان خەسووی ئەوا دروستە تەوقەی لەگەڵ بکات بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە مەحرەمی پیاوەکە نەبێت ئەوکات دروست نیە تەوقەی لەگەڵدا بکات ؛ چونکە جارێکیان ئافرەتێك دەستی بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم درێژکرد بۆ ئەوەی تەوقەی لەگەڵدا بکات بەڵام پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو من تەوقە لەگەڵ ئافرەتان ناکەم ؛ وە دایکە عائیشە ڕەزای خوای لێبێت فەرمویەتی : سوێند بەخوا هەرگیز دەستی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەدەستی هیچ ئافرەتێك نەکەوتووە ؛ وە بەیعەتی لێ وەرنەدەگرتن تەنها بەقسەکردن نەبێت - دەستی نەدەخستە ناو دەستیان - .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**107_ ئایە دروستە ئافرەت لەڕێگەی تەلەفزیۆنەوە سەیری پیاوی نامەحرەم بکات ؟**

_ **وەڵام** : سەیرکردنی پیاوی نامەڕەم لەلایەن ئافرەتەوە دەبێت بەدوو بەشەوە :

**یەکەمیان** : - سەیرکردنی بەشەهوەت و چێژلێ وەرگرتن ؛ ئەمەیان دروست نیە و حەرامە ؛ جا لە ڕێگەی تەلەفزیۆنەوە بێان یان غەیری تەلەفزیۆن .

**دووەمیان** : - سەیرکردنی ئاسایی و بەبێ شەهوەت و چێژ لێ وەرگرتن ؛ ئەمەیان کێشە نیە و ئاساییە لەسەرقەولی ڕاست و دروستی زانایان ؛ بە بەڵگەی ئەو فەرمودەیەی لەسەحیح بوخاری و موسلیمدا هاتووە کە دایکە عائیشە - ڕەزای خوای لێبێت - لەدوای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم سەیری پیاوە حەبەشیەکانی دەکرد کاتێك لەناو مزگەوتدا یاریان دەکرد ؛ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگەی بەدایکە عائیشەدا کەسەیریان بکات بەڵام بێ ئەوەی ئەوان دایکە عائیشە ببینن .

**لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

## 108_ ئایە دروستە ئافرەت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی بچێتە لای پزیشکی پیاو ؟

_ وەڵام : ئەگەر پزیشکی ئافرەت هەبێت و بتوانن بچێتە لای ئەوا دروست نیە بچێتە لای پزیشکی پیاو ؛ بەڵام ئەگەر پزیشکی ئافرەت نەبوو و ناچاربوو ئەوکات دروستە بچێتە لای پزیشکی پیاو بەمەرجێك مێردەکەی لەگەڵ بێت یان پیاوێکی مەحرەمی لەگەڵ بێت .

لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

## 109_ ئایە بۆ سەفەر کردن ئافرەت دەبێت بەمەحرەم بۆ ئافرەت ؟

_ وەڵام : نەخێر ئافرەت نابێت بەمەحرەم بۆ ئافرەتێکی تر لەسەفەرکردن و غەیری سەفەر کردن ؛ مەحرەمی ئافرەت پیاوی مەحرەمە کە بریتیە لە باوك یان باپیر یان برا یان کوری برا یان مام یان خاڵ یان مێرد یان کوڕ یان یان برای شیری یان کوڕی شیری .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

## 110_ ئایە دروستە ئافرەت پۆشاکی کورت و ڕووت لەبەردەم کورەکانی لەبەر بکات ؟

_ وەڵام : نەخێر دروست نیە ئافرەت پۆشاکی کورت و ڕووت لەبەردەم کوڕەکانی یان باوکی یان براکانی لەبەر بکات بۆ ئەوەی نەبێتە مایەی فیتنە ؛ تەنها لەبەردەم مێردی بۆی هەیە هەرجۆرە پۆشاکێك لەبەر بکات .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ صالح الفوزان – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**111_ ئایە دروستە ئافرەت کۆرپەلەکەی لەبەرا بەرێت کاتێك پزیشك پێی دەڵێت کۆرپەلەکەت تەواو نیە و شێواوە ؟**

_ **وەڵام** : ئەگەر کۆرپەلە رۆحی خرابویەبەر ئەوا بەهیچ شێوەیەك دروست نیە لەبار ببرێت ئەگەرچی ببێتە هۆکاری مردنی ئافرەتەکەش یان ببێت بەهۆکاری نەخۆشیەکی مەترسیدار ؛ چونکە ئەم کۆرپەلە نەفسێکی رۆح لەبەرە و کوشتنی حەرامە و دروست نیە ؛ بەڵام ئەگەر کۆرپەلە تەمەنی نەگەییشتبووە چوار مانگ و رۆحی نەخراوبووە بەر و پزیشکەکان بریاریان دا کەمەترسی هەیە لەسەر دایکەکە یان بەشێ،ەیەکی ناتەواو و شێوە گۆڕاو لەدایك دەبێت ئەوکات دروستە لەبار ببرێت چونکە هێشتا رۆحی نەخراوەتەبەر .

**لەلایەنی زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**112_ ئایە ڕاستە ئافرەتان زۆرینەی ئەهلی دۆزەخن ؟**

_ **وەڵام** : بەڵێ ڕاستە ؛ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی : ئەی کۆمەڵی ئافرەتان خێر و سەدەقە بکەن چونکە بەڕاستی ئێوە زۆرینەی ئەهلی دۆزەخن ؛ وتیان لەبەرچی ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ؟ فەرمووی : چونکە ئێوە زۆر لەعنەت دەکەن وە چاکەکەکانی مێردتان پشت گوێ دەخەن .

**لەلایەنی زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .**

**113_ ئایە فەرموودەی ( النساء ناقصات عقل ودين ) بەمانای چی دێت ؟**

_ وەڵام : نوقستانی ئەقل مانای ئەوەنیە کە ئافرەت ئەقلی نوقستان بێت نەخێر ؛ پرسیار لەپێغەمبەری خوا کرا صلى الله عليه وسلم ئایە نوقستانی ئەقڵی ئافرەت لەچیدایە فەرمووی : ئەی ئەوەنیە کە شایەتی دوو ئافرەت بەشایەتی یەك پیاو حیساب نیە - بەهۆی زیاتر لەبیرچوونیان - ؛ وە وترا ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئایە نوقستانی دینی ئافرەت لەچی دایە ؟ فەرمووی : ئەی ئەوەنیە ئافرەت کاتێك بێ نوێژ دەبێت و دەکەوێتە سووری مانگانە نابێت نوێژ بکات و رۆژوو بگرێت .

لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وەلام دراوەتەوە .

114_ ئایە ئەو ئافرەتەی بەهۆی دووگیانیەوە دەمرێت شەهیدە ؟

_ وەڵام : بەڵێ ان شاء الله شەهیدە ؛ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : ( القتيل في سبيل الله شهيد و المبطون شهيد و المطعون شهيد و الغريق شهيد و النفساء شهيدة - و فی رواية : والمرأة تموت بجُمع شهيد - ) . قال الشيخ الألباني : ( صحيح ) انظر حديث رقم : 4441 في صحيح الجامع .

واتە : ئەوەی لە پێناو خوای گەورە دەکوژرێت شەهیدە وە ئەوەی بە نەخۆشی زگ دەمرێت شەهیدە ؛ وە ئەوەی بە نەخۆشی تاعون دەمرێت شەهیدە ؛ وە ئەوەی لەناو ئاودا دەخنکێت شەهیدە ؛ وە ئەو ئافرەتەی بەهۆی دووگیانیەوە دەمرێت شەهیدە .

لەلایەن زانایانی لوجنەی دائیمە - ڕەحمەتی خوایان لێبێت – وەڵام دراوەتەوە .

**115_ لەبەهەشتدا بۆپیاوان حۆری هەیە ئەی بۆ ئافرەتان چی هەیە ؟**

_ **وەڵام** : هیچ ئافرەتێك لەبەهەشتدا بەبێ هاوسەر نیە ؛ ئەو ئافرەتانەی لەدونیادا هاوسەریان هەیە بە باوەرداری مردوون ئەوا لەبەهەشتدا هەر دەبن بەهاوسەری یەکتری ؛ وە ئەو ئافرەتەی لەدونیادا هاوسەری نەبووە ئەوا لەبەهەشتدا دەبێت بە هاوسەری پیاوێکی ئەهلی بەهەشت ؛ کە پیاوانی ئەهلی بەهەشت بۆ ئافرەتان زۆرباشترن لەحۆریەکان .

**لەلایەنی زانای پایەبەرز شێخ محمد بن صالح العثیمین - ڕەحمەتی خوای لێبێت - وەڵام دراوەتەوە .**

**وەرگێڕانی : مامۆستا هەڵگورد مصطفی گەلاڵەیی .**

**2021 / 5 / 9**

**تێبینی : بە بێ ئیزنی وەرگێڕ مافی چاپکردنی ئەم پەرتووکە پارێزراوە .**